# خۆت داپۆشە بەر لەوەی داتپۆشن

ئەی ئەو کەسانەی کە سفورن و حیجاب ناکەن و جلی ناشەرعی ئەکەنەبەر،نەسیحەتی من بۆ تۆ و تەواوی ئەو خوشکانەی لەم بارەوە بێ فەرمانی خودا دەکەن،واللەهی رازی کردنی خودا لە دونیا لە هەموو شتێ باشترە بۆتان.

ئەی ئەو خوشکانەی جلی نیمچە ڕوت و تەسک و تەنک و ناشەرحیان لەبەر دایە،تکاتان لێدەکەم پێش ئەوەی مردن رێگەتان پێبگرێت بگەڕێنەوە بۆ لای خودای پەروەردگار،بیربکەنەوە هەر ئێستا تۆبەی لێبکەن واز لەو سفوریە بێنن بەتایبەتی،وە هەروەها ئەو جلە تەسک و نیمچە ڕوتانە بێنن.

بیر بکەنەوە لەو رۆژەی جلی قیامەت دەکەنە بەرتان،جلی قیامەت مۆدێلاتی نیە وە تەسک و تەنک و کورت نیە ئەسلەن داتان دەپۆشێت ،ئەو دەم چاوە جوانانەی ئێستا بۆتۆکس و تەجمیلی دەکەن و حەدەسەی بۆ دادەنێن لەناو ئەو کفنەیا شاراوە دەبێت،ئەو قاچەی ئێستا تەسک و ڕوتی دەکەن بۆ خەلک واللە کفن هەمووی داپۆشێت.

بیر لەو رۆژە بکەنەوە کە بەبێ کەسی دەمێنەوە بیر لەو کاتە بکەنەوە چەند ئافرەتێ لەبەر خودا دەتان شۆرن و کۆتا دەست نوێژتان پێ هەلەگرن و ئەو کفنە سپیەتان لەبەر دەکەن،بیر لەو رۆژە بکەوە کە ئێوە لەسەر شانی مسوڵمانان بەرێ دەکرێن بۆ گۆرستان وە بیر لە گۆرستان بکەنەوە،کۆرستان وەک ئەم دونیا نیە وەک ژورێ نیە مۆدێلات و خۆشیەکانی ژیانی تیابێ،گۆڕستان چۆڵەوانیە تاریکیە بەبێ دایک و کەسوکار ژیان بەسەر دەبەیت.

لە دوای مردنمان هەموو مرۆڤێک لە ناو گۆرەکەی بەتەنیا سێ پسیاری ئاراستە دەکرێت،پسیارت لێ دەکرێت.

خودات کێیە ؟ ئاخەر خوشکە بەرێزەکەم لە دونیا وەڵامی خودات نەدابێتەوە لە قەبرا چۆن وەلام دەدەیەوە واللە زمانت لاڵ دەبێت،تۆ لە دونیا وەڵامی پێغەنبەرکەت نەدابێتەوە بەدەم بانگەوازیەکەی نەچووبی و گوێرایەڵی نەبووبی لە قەبرا ناتوانی بلێێ محمدی کوری عبداللە پێغەمبەرمە.

چ دینێکت هەڵبژارد ؟ تۆ ناتوانی بلێێ دینم ئیسلام بوو چونکە ئیسلام تەنیا نوێژ و رۆژی نیە،بۆیە بیر لەو رۆژە بکەوە کە دوو مەتر خۆڵ دەکەن بەسەرتا و دات دەپۆشن.

بیر لەو ڕۆژە بکەوە دایکت نیوو سەحات لات نابێ باوکت ئامادەنیە تاکوو بەیانی ئاگاتی لێبێت،هەموو جێت دەهێڵن وە هەمووومان یەکتری جێ دەهێلین و بەتەنیا لەم گۆڕەیا دەمێنینەوە ئیتر هەمووی دەچێ بۆ لای ماڵ و منالّی و سەر ژیانی خۆی تەنیا تۆ بەتەنیا دەمێنیتەوە ناکرێ تا هەتایە باجی سفوریێ بدەیت،ڕازی کردنی خودا بەرێزەکەم لە هەمووشتێ گرنگ ترە.

کاتێ تۆ جلێکی ناشەرحی یان جلی ڕوت و تەسک لەپێ دەکەی بەناو بازاڕ و زانکۆ و شوێنە گشتیەکان ڕێکەیت بۆ واکەیت خەلک لێت ڕازی بێت ؟! ئەمە گەورەترین فەشەل و گەورەترین دۆڕانە.

گەر مرۆڤی مسوڵمان بیەوێ خوا لەخۆی ڕازی بکات خەلکیش لێی ڕازیەبێ بەلام گەر بەرزی کردنی خەلک خودا لەخۆت توڕەکەیت خەلکیش لێت ڕازی نابێت.خوشکە بەرێزەکەم گەڕانەوەی تۆ بۆ لای خودا لە ئێستاوە واجبە لەسەرت نەک ساڵێکی تر و دوانی تر،چونکە هەجەل ئەمڕۆ و بەیانی گەنج و پیری نازانێ ئەوەنەیە دەزانی خەلکێ لە گەشتا مرد لە سەفەری ئەوروپا و لە ئاهەنگ و خەوێکی خۆشا دەمرێ.

بۆیە بەرێزەکەم نەسیحەتی من بۆ و تەواوی ئافرەتان لە خودا بترسن و ڕوبکەنە ئەو خودایەی گوێبیستمانە و دەمان بینێت و هەمووشتێ دەزانێ ناکرێ ئەوەندە فەرمانی خودا بشکێنین،ئاخەر ئێمە لەم دونیا فانیە ناتوانین فەرمانی دەسهەڵات دارێ و گەورەیێ بشکێنین ئەی بۆ فەرمانی خودا دەشکێنین؟ ئەمە حیساب نەکردن نیە بۆ خودا دیارە بەتەما نین ڕۆژێ بگەڕێینەوە لای وە چاوەڕێی ئەم پاداشتە نی کە بەهەشتی نەبڕاوەیە.

**ئاگاداربە دیدارێکمان ماوە لە گەل خودا.**

بۆیە خوشکە بەرێزەکەم پێویستە لەسەر تۆ و تەواوی ئەو ئافرەتانەی ڕویان کردۆتە دونیا واز لەو سفوریە و جلو بەرگە ناشەرحیانە بێنن جل و بەرگی شەرحی و حیجاب بکەنە بەرتان تاکو خودای گەورە لە قیامەت سەرفراز و ڕوو سپیمان بکاتە قسمەتی هەموو لایێکمان.

خوای باڵادەست چەند جوان لە وەسفی حیجاب دا لە واجب کردنیدا دەفەرموێت:

بالاپۆشی و حیجاب

**(ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَنْ يُعْرَفْنَ)**

واتە:ئەوە لەبارترین و باشترین شتە کە پێی بناسرێن.

**(وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَٰهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ)**

واتە:نابێ ئێوە وەکو سەردەمی جاهیلیەتی کۆن جوانی و زینەتی خۆتان بۆ پیاوان دەربخەن.

**(يا بني آدم قد أنزلنا عليكم لباساً يواري سوآتكم وريشاً ولباس التقوى ذلك خير )**

واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم ئەوە ئێمە پۆشاکێکمان بۆ دابەزاندوون بۆ ئەوەی کە عەورەتتان داپۆشێ و خۆتان پێ برازێنەوە، وە پۆشاکی تەقوا و ئیمان و لە خوا ترسان باشترین پۆشاکێکە کە خەڵکی خۆی پێ برازێنێتەوە.

❖ ڕەحمەتی خودا لەوکچەی گوێی لە فەرمانی خودابوو،

کە دەفەرموێت: **(وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ)**

واتە: جوانی خۆیان دەرنەخەن...

- گوێڕایەڵی کرد.♥

## حەدیسێکی پێغەمبەرمان ﷺ دەربارەی سفوری ...

پێغەمبەرمان ﷺ لە حەدیسێکی سەحیحی(ئیمامی مسلم)داهاتووە کە دەڵێت ئافرەتانێك دێن کە من نەم بینیوون بە شێوازێ باسیان دەکات کە ئەو ئافرەتانە لەم سەردەمەدا زۆرن .

**(نساء كاسيات،عاريات،مائلات،مميلات)**

ئافرەتانێکن کە سفورن و جلیان لەبەرە بەڵام وەک ئەوە وایە لەبەریان نەبێت وە سەرنجی خەڵکی بۆخۆیان ڕاکێشن و کاریگەریان دەبێت لەسەر ئافرەتان و کچانی تری تازە پێگەشتوو وە پیاوانیش توشی نەزەر و گوناح دەکەن.

ئەم ئافرەتانە لە فەرمانی خودا دەچوونە،هەرچەندە باوەریان بە خودا و پێغەمبەرە وە نوێژ دەکەن و قورئان دەخوێنن.

پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی...یەکێکن لەو کەسانەی کە بۆنی بەهەشت ناکەن و وە بەهەشت بەچاوی خۆیان نابینن و شوێنیان ئاگری دۆزەخە.!

ئەو بۆنەی بەهەشت کە ٥٠٠ ساڵ ڕێ دەروات بە هۆکاری ئەو سفوریەت بۆنی ناکەی و بەهەشتی نەبڕاوە لە دەستت دەدەیت.

نەکردنی بالاپۆشی و حیجاب تاوانی تەنیا بۆ خۆت نیە بۆیە پێویستەکا بیکەیت.

کە دێیتەوە لە زانکۆ بە سفوری چەند گوناحت بۆ دەنوسرێت بەهۆی سەیرکردنی پیاوان و وە هەروەها دەرچون لە فەرمانی خودا.

بەخوا خوشکە گیان گوناعێکی ٥ بۆ ٦ سەحاتی کە دێیتەوە لە زانکۆ بە نوێژێکی ٥ خولەکی ناسرێتەوە زۆر زەحمەتە.

ئێستاش ئامادەنی واز لەو سفوریەتی و لەپێکردنی ئەم جل و بەرگە تەسک و تەنکە بێنی کەدەت بات بەرەو و ئاگری دۆزەخ؟

تەنیا بیر لەمردن بکەوە،کە مردیت بەو سفوریەت چ جوابێکی خودا دەدەیتەوە؟**!**

..........................................................................

## (واتقوا يوما ترجعون فيه الى الله)

بترسن لەو ڕۆژەی دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا.

## سود و گرنگی حیجاب و باڵا پۆشی

١:ئارام بەخشە بۆ دڵ دەرون ئاسودەت دەکات،بە پاکی ڕای دەگرێت.

٢:شەرم و حەیایە بۆ ئافرەت.

٣:ڕێز و شکۆیە، وادەکات بەرامبەرکەت شەرمت لێ بکات و ڕێزت بگرێت.

٤:دەتپارێزێ لە خراپە و بەد رەوشتی.

٥:کەسی باڵا پۆش خۆی و خەلکی دەپارێزێ لە گوناح.

٦:خۆشەویستت دەکات لەلای خودا.

٧:حیجاب و باڵاپۆشی حیبادەتە،لەو ساتەی دەچیتە دەرەوە لە ماڵ تا دەگەرێیتەوە تۆ لە حیبادەتای.

٨:رێگاییێکە بۆ گەشتن بە ڕەزامەندی خودا،چونکە ئەمرێکی خودای بە جێ هێناوە.

٩:رێگەییێکە بۆ گەشتن بە بەهەشت،ئەزانی؟ حیجاب لە نوێژەکەت و ڕۆژووەکەت گەورەترە حیجاب بۆ ئافرەت واتا بەهەشت!!

١٠:حیجابەکەت بۆ دایک و باوکیشت دەبێتە گەرەی لەبەردەمی خودا لە رۆژی دواى.

حیجاب و باڵا پۆشی لە دونیادا پێوەر نیە بۆ باشی و خراپی ئافرەت، **بەڵام**

لە قیامەت پێوەرە بۆ چوونە بەهەشتی ئافرەت،چونکە واجبە وەک نوێژ.

به جۆرێک خۆت داپۆشه

گەر پێغەمبەر محمد ﷺ تۆی بینی

زەردەخەنە بکات و بڵێت

عائیشه ئەمە نەوەکەتە!!





**تێبینی** : حیجاب تەنیا بەم شێوەیە دروستە، نابێ قژت بەدەرەوە بێت وە نابێت دیار بێت وە حیجاب لە گەڵ پانتۆل و جل و بەرگێ ناکرێ کە تەسکبێت،هەرچەندە لە سفوری باشترە،وە بالاپۆشی و حیجاب وەک ئەو وێنەی سەرەوە دروستە.

خوشکی بەرێز چۆن ئێمە لە پێنا خودا ئەمەمان ئامادەکردوە وە گەشتۆتە لای ئێوە تۆش دەتوانی خێر و چاکەت دەسکەوێت بە ناردنی بۆ دوو کەس،ئەمە لە پێناو خودا بکە و خودا بێ ئومێدت ناکات...




گەر تەنیا بۆ دوو کەس بنێرین دەگات بە هەزاران کەس و ان شاء الله سودمەند دەبن.

ئامادەکردنی : لە پیناو خودا

لە رێکەوتی: ٢٠٢٣/٧/١٧